



# حیکمەتەکانی شەمس و مەولانا

گوڵبژێری جوانترین

زانا خەلیل کردوویەتی بە کوردی



خانەی کولتوور | بۆ چالاکیی ئەدەبیی و فەرهەنگی
زنجیرەی کتێب٢٧

# حیکمەتەکانی شەمس و مەولانا

وەرگێڕانی: زانا خەلیل

ژیان و گولبژێری جوانترین

بەرگ: تێکۆشەر خالید

ناوەڕۆک: کولتوور

چاپ: یەکەم ٢٠٢١

چاپخانە: تاران

تیراژ: 1000 دانە

ژمارەی سپاردن: ٢١٥



**Jalaluddin rumi**

جەلالەدین رۆمی (١٢٠٧_١٢٧٣)

**شاعیر و فەیلەسوف**

# جەلالەدین رۆمی

محەمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی حوسێن بەهائەدینی بەلخی بەکری، بە فارسی (جلال‌الدین محمد بلخی)،

بە تورکی Mevlânâ Celâleddîn-i Rûmî ،

شاعیر و زانا لە فیقهی حەنەفی و خاوەنی مەسنەوی و تەریقەتی مەولەوی، لە ساڵی ١٢٠٧ لە شاری بلخ لە ئەفغانستان لە دایکبووە، لە تەمەنی چوار ساڵیدا لەگەڵ باوکی چوونەتە بەغداد و لەوێ لە قوتابخانەی موستەنسەرییە دەستی بە خوێندن کردووە، دواتر لەگەڵ باوکی گەشتی زۆریان بە زۆر وڵاتاندا کردووە تا لەسەردەمی سەلجووقییە تورکەکان لە شاری قونییە دەگیرسنەوە..

مەولانا لە فیقهـ و زانستەکانی ئیسلامدا باڵادەستبوو، لە قونییە لە چوار قوتابخانەدا وانەی دەگوتەوە، بەڵام دوای

مردنی باوکی وازی لە وانە وتنەوە هێنا و خۆی خەریکی

وەرزش و بیستنی مۆسیقا و شیعرنووسین کرد.

شیعر و نووسینەکانی کە زۆرینەی بە فارسی و بەشێکیشیان

بە عەرەبی و تورکین کاریگەرییێکی زۆریان بەسەر کولتووری

جیهانی ئیسلامی بە گشتی و کولتوری فارسی و عەرەبی و

بەنگالی و تورکی هەیە، لە چاخی ئێستاشدا کارەکانی

تەرجەمەی زۆربەی زمانانی جیهان کراوە، لە ساڵی ۲۰۰۷

BBC_ڕایگەیاند، دیارترین شاعیری ئەو ساڵە لە

ئەمەریکادا، جەلالەدین ڕۆمییە.

لە ساڵی ۱۲۷۳ لە شاری قونییە کۆچی دوایی کرد و هەر لەو

شارەدا نێژرا، دوای مردنی شوێنکەوتووان و دەروێشەکانی

تەریقەتی مەولەویان دامەزرانی بە سەمای بازنەیی بەناوبانگن

و گۆڕیشی لەو کاتەوە تا ئێستا بۆتە مەزار.

سڵاو لەوانەی پێدەکەنن و

دڵیشیان پڕە لە ساڵانێکی پڕ لە گریان

ئەوانەی بڕیاریان داوە بژین و

هێشتایش ژیان ئەو شانسەی پێنەبەخشیون.

•

زۆر ڕێگا هەن بتگەیێننە لای خوا

من خۆشەویستییم هەڵبژارد

تا بگەم بە خوا.

به دوای خۆمدا گەڕام

جگە لە خوا هیچیترم نەدۆزییەوە.

بە دوای خوادا گەڕام

جگە لە خۆم هیچیترم نەدۆزییەوە.

●

ئەی خۆشەویست

وەک مەلابانگدان بانگم بکە

چونکە من وەک نوێژ غەریبیت دەکەم.

نیشتمانم نییە

ئەویَ نیشتمانمە کە تۆی لێیە.

•

عەشق

ئەو سەفەرەیە

لە خۆتەوە

دەتگەیەنێتەوە خۆت.

هیچ شتێ مەچێنە

ئەگەر بە خۆشەویستیی نەبێ.

•

مۆسیقا

زمانی خوایە.

ئەی عاشقان

ئاسمان خۆشەویستیی دەبارێنێ

با لە ژێریدا سەما بکەین و

پێیەوە بمرین.

•

لەو ماڵەدا،

هەموومان میوانین.

تۆ دڵۆپێک نیت

لە زەریا

تۆ تەواوی زەریایت

لە دڵۆپێکدا.

•

ئەوانە ماڵئاوایی لە یەکتر دەکەن

کە بە چاو عاشقی یەکترن

بەڵام ئەوەی کە بە ڕۆح و دڵ

عاشق دەبێ

هەرگیز جیانابێتەوە.

ئەو خۆشەویستییەی

کە تەنیا گرنگی

بە جوانیی جەستە دەدا

خۆشەویستییەکی حەقیقی نییە.

●

ئاگر دووکەڵی نامێنێ

کە دەبێتە مەشخەڵ.

گوێ لە دەنگی نای بگرە

چۆن ژانی حەنین پەخشان دەکا و

دەڵێ:

لەو کاتەوەی لە دارستان بڕێندراوم

بیری ئەسڵی خۆم دەکەم.

•

نەفس لە زۆر ستایش کردندا

دەگۆڕێ و

دەبێتە فیرعەون.

من لە خۆم دەچم،

هەر یەکێکمان

لەویتر دەچین.

•

کراسی یوسف کە بە یەعقوب گەیشت

مژدەی ویساڵ بوو.

نائارام مەبە لە برینت

ئەگەرنا نوور

چۆن دەچێتە ناخت؟

•

بە دوای

چیدا بگەڕێیت

بە دواتدا دەگەڕێ.

ئەی برام

تۆ تەنیا فکریت و

ئەویترت هەمووی

ئێسک و پێستە.

•

ئەگەر زۆرت هەیە

لە سەروەتت

ببەخشە و

ئەگەر کەمت هەیە

ئەوە لە دڵت ببەخشە.

عەشق کانییە

نوقمبە لەناویدا.

•

هەمیشە عەتر

لەو دەستەدا

دەمێنێتەوە

کە گوڵ دەبەخشێ.

تۆ بە دوو باڵەوە خولقاوی

ئەی بۆ لات باشترە

بە گاگۆڵە ژیان ببڕی؟

•

کە جوانیت لە دڵی خۆتدا دۆزییەوە

لە هەموو دڵێکدا

دەیدۆزیتەوە.

چ زیانێکت پێدەگا

ئەگەر ئەو جیهانە

هەموو ڕووناکییەکانی بە ڕووتدا بکوژێنێتەوە

مادەم نوور

لە دڵتدا دەدرەوشێتەوە.

•

حەقیقەت ئاوێنەیەک بوو

لە دەستی خودا کەوت و

پارچە پارچە بوو

هەر کەسێ پارچەیەکی برد و گوتی:

من ئاوێنەیەکی تەواوم هەیە.

ئەی نووری دڵ وەرە

ئامانجی هەست و موراد وەرە

ئەی زەریفی دنیا سڵاوت لێبێ

دەوا و

تەندرووستیم

بە دەست تۆیە.

•

هەموو شتەکان کە راڤە دەکرێن

رۆشن دەبنەوە جگە لە عەشق

کاتێ عەشق هیچ راڤەیەکی بۆ ناکرێ

رۆشنتر دەبێتەوە.

ئەو قسانەت لەگەڵ دەکەم

کە پێویستییان بە لێو و زمان نییە

لە نێوان هەموان بۆت دەدوێم

بەڵام جگە لە تۆ کەس نایبیستێ.

•

کێ چرای لە سینگیدا هەڵگرتبێ

تاریکیی هەموو دنیای بۆ گرنگ نییە.

نەخۆشی تۆم

هەر کاتێ غەریبیت دەکەم

حاڵم خراپتر دەبێ.

•

لە دیدی من هیچ شتێ

لەو دنیایە لە پێکەنینی

راستگۆیانەی منداڵ

بە نرختر نییە.

تاکە جوانییەک

کە تا ئەبەد دەمێنێتەوە و

پیر نابێ

جوانیی دڵە.

•

هیچ شتێ لەنێوان من و تۆدا نییە

بەڵام لە نێوان

دڵم و

دڵی تۆدا

هەموو شتێ روویداوە.

ئەو دنیایە

لە سەریەوە تا پێیەکانی

لە ئێش و کارەساتدا غەرق بووە

هیچ ئومێدێکی چاکبوونەوەی نییە

جگە لە دەستی خۆشەویستیی.

•

عەشق رووبارە

لێی بخۆوە.

هەتا ئەگەر جەستەشمان لێک دووربێ

پەنجەرەیەک لە دڵمدا دەمێنێ

کە دەڕوانێتە تۆ

لەوێوە پەیامی بێدەنگت

بەسەر دادەبارێنم

رێک وەک ئەوەی کە مانگ دەیکا.

•

خۆشەویستیی ئەو پردەیە

لە نێوان تۆ و هەموو شتێک.

ئاسانە کەسێ لەناو کۆمەڵدا بوەستێ

بەڵام ئازا ئەو کەسەیە

کە دەتوانێ بە تەنیا بوەستێ.

•

کە بڕیارتدا سەفەر بکەیت

ئینجا ڕێگاکەت بۆ دەردەکەوێ.

ڕۆح چییە ؟

بە بێ خۆشەویستیی

جگە لە تارماییێکی

بێڕەنگی نێژراو

لە جەستەدا.

•

ئەی موسافیر

دڵت لە هیچ ماڵێک دامەنێ

گەرنا لە کاتی ڕۆیشتنت

غەمگین دەبیت.

خوای من، رۆحم ببە ئەو شوێنەی

کە بتوانم تێیدا بە بێ وشە

قسە بکەم.

•

لە مەخلوقەکان ماندوو بووم

جوانیی خالقم دەوێ

بەڵام کاتێ سەیری ئەوێ دەکەم

خۆم دەبینم

کاتێ سەیری خۆشم دەکەم

ئەو جوانییە دەبینم.

دەنگ هەیە وشە بە کار ناهێنێ

جوان گوێی بۆ بگرە.

•

فێری بیرکردنەوە بووم

دواتر فێری بیرکردنەوە بووم لەناو قاڵبەکان

دواتر فێربووم بیرکردنەوەی راست

لە رێگای بیرکردنەوەیە

لە تێکشکاندنی قاڵبەکان.

ئەوان بە خوێن و بە فەناوە سەرقاڵن

ئێمەیش سەرقاڵی مانەوەین

ئەوان تەپڵی جەنگ لێدەدەن

ئێمەیش تەپڵی خۆشەویستیی.

•

تەنیا بە دڵ دەتوانی

دەست لە ئاسمانەکان بدەیت.

دەتوانم لە هەموو کەسێ

دوور بکەومەوە

جگە لەو کەسەی

کە بە دڵی دەوری گرتووم.

•

کاتێ گوڵ کاتی تێپەڕی و

باخچەکەی مرد،

ئیدی گوێ لە بولبول ناگرێ

ژیانی خۆی بۆ

بگێڕێتەوە.

بە دوای ئەو کەسانەدا بگەڕێ

کە ژیانت ڕووناک دەکەن.

•

ئەگەر لێمبپرسی چەند جار

هاتوومەتە بیرت؟

دەڵێم: یەکجار

چونکە هاتیت و

ئیدی بە جێتنەهێشتووم.

با چاوت هەر لەسەر نوور بێ

تا هەموو ئەو تاریکیانە دەبڕیت.

•

ئەگەر بە سەد هەزار زمانیش

ستایشی عەشق بکەیت

هێشتا جوانییەکەی خۆی زیاترە

لە هەموو ئەو منگە منگانە.

مۆسیقا خۆراکی

هەموو خۆشەویستانە.

•

ببە چرا

ببە بەلەم

ببە پەیژە

ببە شیفا

بۆ هەموو رۆحە ویڵەکان.

بێ خۆشەویستیی مەبە

تا هەست نەکەی مردووی

لە خۆشەویستییدا بمرە و

تا ئەبەد بە زیندوویەتی بمێنەوە.

•

بدرەوشێوە

وەک ئەوەی ئەو گەردوونە

هەمووی هی تۆبێ.

سڵاو لەوانەی بە نهێنییەوە عاشقن

ئەوانەی کە زانیان

پەیوەندی ئاشکرا

بەردەوام نابێ..

ئەوانەی ئەو قەولەیان خۆشدەوێ:

وەک دوو درەخت

خەڵک بەنێوانماندا دێن و دەچن و

ناشزانن کە ئێمە

ڕەگەکانمان

تێکئاڵاون.

ناتوانم پێتبگەم و

ناشتوانم لە خۆمت جیا بکەمەوە.

•

گوتی: ئەوەندە جار لە دوای جار

تەماشای خۆت مەکە

تەنیا تەماشامکە

من چەند لە تۆ

نزیکترم

لە خۆت.

ئەوەی بە دوای فتنەی عەشق رانەکا

بە رێگایەکدا دەڕوا

هیچ شتێکی زیندووی تێدا نییە.

•

ئەی دڵی من بێئومێد مەبە

موعجیزە نیشتەجێی

شوێنە شاراوەکانە.

من بە رۆحم خۆشمدەوێیت و

رۆحیش هەرگیز ناوەستێ و

لە یادیش ناکا.

•

کاتێ یەکەمجار

هەستم بە خۆشەویستیی کرد

دەستم کرد بە گەڕان بە دوای تۆدا

کوێر بووم و

نەمدەزانی کە عاشقەکان

بە یەک ناگەن، چونکە هەر یەکێکیان

تا ئەبەد لەناو ئەویتردا نیشتەجێیە.

مەعشوقێک بە عاشقێکی گوت:

بە شارانی زۆردا خولایتەوە

زیاتر حەزت لە کام شار کرد؟

عاشق گوتی: ئەو شارەی

کە یەکێ دڵمی تیا رفاند.

•

بەڵام من

ئەو رۆژە جەژنمە

کە رووخساری خۆشەویستەکەمی تیا دەبینم.

هەر کەس

بە عەشق نەمری

لاشەیە.

•

هەموو کەس

گوێی لە دەنگمە

جگە لە تۆ..

تۆ گوێت لە دڵمە.

کاتێ قۆناغێکی سەخت

لە ژیانت تێدەپەڕێنی

ژیانت وەک رزگاربوویێ تەواو بکە

نەک وەک قوربانیییێک.

•

دەبێ هەندێ کات

بێدەنگبین

تا فێری قسەکردن بین.

لەگەڵ زەمەندا

ئێشەکان دەبنە خەم و

خەم دەبێتە بێدەنگیی و

بێدەنگیی دەبێتە تەنیاییێکی

گەورە و فراوانی

هێندەی ئۆقیانۆسنە تاریکەکان.

•

لەو کاتەی عەقڵ

جگە لە سنوور هیچ شتێ نابینێ

دڵ هەموو ڕێگە پیرۆزەکان پێدەزانێ.

یەکێ لەگەڵ کەسێک بێت کە تێیناگا

وەک دیل وایە.

•

دەبێ شتێ لە تۆدا بسووتێ

تا نوور لە قووڵاییەکانتدا

بدرەوشێتەوە.

خۆشەویستیی

ئەو شادییەیە

کە بریندار دەکا.

•

لێم پرسی: ئەو دڵە بچووکەی من

چۆن جێی ئەو هەموو ئێشەی لێدەبێتەوە؟

وەڵامی دامەوە: تەماشای چاوەکانت

بکە چەند بچووکن

کەچی هەموو گەردوونی پێدەبینی.

بارت سووککه..

تا بفڕیت.

•

واز لەو بەیانییە مەهێنە

لێمەگەڕێ تێپەڕێ

بێئەوە نیگایێ بگرێتە دڵت

ئەوانەی لە سپێداندا دڵی خۆیان لە بیرکرد

ئەو خۆرەشیان لە بیرکرد

کە ئاوا نابێ.

هەتا ئەگەر بە توورەیشەوە بڕۆیت و

هەزاران ساڵیش لێم دوور بیت

هەر دەگەڕێیتەوە لای من

چونکە من ئامانجتم.

•

کەس ناچار مەکەن

ڕۆحتان لە ئامێز بگرێ

خۆشەویستیی

وەک ئاین وایە

بە زۆر نابێ.

با مەعنات لێ بەرزبێتەوە

نەوەک دەنگ

ئەوەی گوڵ دەڕوێنێ و

دەیپشکوێنێ

بارانە نەک برووسک.

•

هەردوو چاوەکانت داخە و

بە چاوی سێیەم بڕوانە.

بەردەوامبە

لە شکاندنی دڵت

تا دەیکەیتەوە.

•

خۆشەویستیی

لە هەموو ئاینێکدا هەیە

بەڵام خۆشەویستیی

بە خۆی دینی نییە.

فەرامۆشکردن

پەیامێکی رۆشنی کورتە

ناونیشانەکەی ئەوەیە:

دوورکەوە.

•

ئەی مانگ

لەگەڵ تۆ

کەی زەوی

تاریک دادێ؟

•

عەشق وازهێنانە

لە هەڵبژاردن.

لەگەڵم بیت، تەواوی شەو ناخەوم

لەگەڵم نەبیت، تەواوی شەو ناتوانم بخەوم

چ جیاوازییێکی گەورە لە نێوانیاندایە

لەگەڵ ئەوەش کە هەردووکیان

هەر نەخەوتنن.

•

گرنگ ئەوەیە رۆحێک بدۆزیتەوە

رۆحت کامڵ بکا

کەسێ بدۆزەوە کە ببێتە ئاوێنەت.

ئەوە خۆشەویستییە

تاڵ شیرین دەکا و

خۆڵ دەکاتە زێڕ و

تۆران دەکاتە سەفا و

ئازاریش بە شیفا

ئەوە خۆشەویستییە

ئاسن نەرم دەکا و

بەرد دەتوێنێتەوە و

مردوو زیندوو دەکاتەوە و

ژیانێکی نوێی پێدەبەخشێ.

یەکێ مانگی بوێ

شەو بەلاوە نانێ

یەکێ ئارەزووی گوڵ بکا

ترسی لە دڕکەکانی نابێ

یەکێکیش هەوڵی

خۆشەویستیی بدا

لە خودی خۆی هەڵنایێ.

•

ڕۆحت چەند لە ڕۆحم نزیکە

من بە یەقینییەوە دەزانم

بیر لە هەرچی بکەیتەوە

بە ناو زەینی مندا تێدەپەڕێ.

•

پێتوایە زیندوویت

تەنیا لەبەر ئەوەی

هەناسە دەدەیت.

•

عاشق نه موسڵمانه و

نه مەسیحی و

نه بەشێکیشه له هیچ باوەڕێک

ئاینی عەشق هیچ مەزهەبێکی نییه

تا باوەڕی پێبێنی

یا باوەڕی پێنەهێنی.

•

له گەڕان بەردەوامبە

سەرەڕای ئەوەی

هیچ شوێنێکیش نەبێ

پێیبگەیت.

•

کانیێک

لە ناختدایە

بۆچی بە گۆزەی بەتاڵ

دەسووڕێیتەوە؟

•

ئەی دڵ

واز لە هەموو شتێ بێنە

هەموو شتێکت دەبێ.

•

ڕێگا بەرەو ئاسمان

لەناو تۆدایە

تەنیا باڵەکانی خۆشەویستیی

بجوولێنە.

●

واز لەعاشق بێنە

لە گەردوونی خۆیدا.

تەنیا حزوورت

دڵی تواوەم

دەبوژێنێتەوە.

•

من وەک ئینسان قبوڵ بکەیت

لای خوا گرنگترە

لەوەی پرسیاری ئیمانم لێبکەیت

ئێمە هەموومان

لقەکانی یەک درەختین و

حەنینمان

بۆ ئەسڵمان هەیە.

من نەهاتووم

شتێکی نوێت پێببەخشم

هاتووم ئەو جوانییەت لێدەربێنم

کە نەتدەزانی لەناو تۆدا هەیە.

•

وێنەت لە چاومدایە و

ناوت لە لێوانم جیانابێتەوە و

یادت لە قووڵایی رۆحمدایە

ئەی کەوایە من بۆ کێ دەنووسم

کە تۆ لەو هەموو شوێنەدا دەخولێیتەوە؟

قەڵەم بشکێنە و کاغەز بدڕێنە.

ئەو ئیلهامەی بە دوایدا دەگەڕێیت

پێشتر لە ناختدا هەیە

تۆ تەنیا بێدەنگبە و چاودێری بکە.

•

رۆح گوێی هەیە

دەتوانێ ئەو شتانە ببیستێ

کە عەقڵ ناتوانێ بیبستێ و بشیزانێ.

خۆت هەڵدە نێو رووباری عەشق

هەتا ئەگەر رووبارێکی خوێنینیش بێ.

•

من خۆشەویستییم خۆشدەوێ و

خۆشەویستییش منی خۆشدەوێ

باڵەکانم بۆ خۆشەویستیی کردەوە و

خۆشەویستییش

وەک خۆشەویست

لە باوەشی گرتم.

ئەگەر داوای مرواری دەکەیت

دەبێ نوقمبیە قووڵایی دەریا

کەنار چی لێیە جگە لە کەف.

•

گوتم:

نامرم بەر لەوەی نەتناسم

گوتی:

هەر کێی بمناسێ نامرێ.

لە دەریای خۆشەویستیی

وەک خوێ توامەوە

نە کفرما و نە ئیمان

نە گومان ما و نە یەقین

هەسارەیێ لە دڵمدا دەدرەوشێتەوە

حەوت ئاسمانی تیا حەشار دەدرێ.

•

تەنیا رۆح

لە ماهیەتی عەشق تێدەگا.

ئەگەر پیڕانەگەیشتی

خۆشیانبوێی

پیڕابگە خۆشتبوێن.

•

خۆشەویستیی تەفسیر ناکرێ

ئەوە خۆشەویستییە

تەفسیری هەموو شتێ دەکا.

•

شتەکان خۆیان دێن

بەبێ هیچ کۆششێک

یا خۆیان تائەبەد دەڕۆن

سەرباری هەموو کۆششێکیش.

•

# شەمسی تەبرێزی

محەمەدی کوڕی ملک دادی تەبرێزی (١١٨٥_١٢٤٨) شاعیر و عاریف، زۆربەی شیعرەکانی بە فارسی نووسیوە و کەمێکیش بە تورکی و عەرەبی، لە تەبرێز لە دایکبووە و بە مامۆستای ڕۆحی مەولانا جەلالەدین ڕۆمی دادەنرێ، دیوانی تەبرێزی نووسیوە، کە بە دیوانی گەورەش ناوی دێت.

گەشتی زۆری کردووە لەوانە حەلەب و بەغداد و قونییە و دیمەشق، لە ساڵی ١٢٤٤ چاوی بە مەولانا جەلالەدینی رۆمی دەکەوێ و دواتر پەیوەندییێکی هێندە پتەویان دەبێ کە کاریگەریی لەسەر ژیانی هەردووکیان دەبێ، ئەو پەیدەندییە ژیانی ڕۆمی لە کەسێکی ئایینیی ئاسایی بۆ شاعیرێک گۆڕی کە بە خۆڕ عاتیفەی دادەباراند.

مردنی:

بە گوێرەی سەرچاوەکان کۆچی دوایی تەبرێزی لێڵ و ناڕۆشنە، هەندێ دەڵێن: بە دەستی شوێنکەوتووانی ڕۆمی کوژراوە چونکە

لەبەر بەهێزیی پەیوەندیەکەیان غیرەیان لێیکردووە، بەڵام هەندێ بەڵگەی دیکە هەن کە دوای جێهێشتنی قونییە لە شاری "خوی" کۆچی دوایی کردووە، لە شاریَ خوی گۆڕێک هەیە دەڵێن: هی شەمسی تەبرێزییە و یونسکۆ هەڵیبژاردوە کە ببێتە شوێنەواریی جیهانیی.

خۆشەویستیی ئەوەیە: نەترسی
ئەگەر لە ناوەڕاستی بەحری
ترسیشدابیت.

•

ئەو کەسەی لە خۆتەوە
بەرەو خۆت دەتڕفێنێ
شیاوی خۆشەویستییە.

زۆر گرنگی به قسه‌کردن مه‌ده

چونکه له شاری عه‌شق

هیچ زمانێ گرنگ نییه و

له بنه‌ڕه‌تیشه‌وه پێویست به وشه ناکا..

عه‌شق ته‌واو بێده‌نگه.

•

بێده‌نگییش ده‌نگی هه‌یه

به‌ڵام پێویستی به رۆحێکه لێی تێبگا.

لامان وایە ئەو لەسەرەوە دەمانبینێ

بەڵام ئەو لە ناوەوە لێمان دەڕوانێ.

•

ئەوەی بە دوایدا دەگەڕێیت

لەناو تۆدا

وجودی هەیە.

تۆ ئەی ئەوەی رووخسارت

خۆری رۆحمە لێم دوور مەکەوە.

•

جیاوازییێکی گەورە لە نێوان

رۆژهەڵات و رۆژئاوا و

باشوور و باکووردا نییە

رووت لە هەر لایێ بێ

پێویستە وا لە سەفەرەکەت بکەیت

رۆیشتنبێ بەناو ناختدا.

ئەو دەرگایەت بۆ ناکرێتەوە

کە لێی نادەی.

•

ئەگەر بەهەشت و ئاگر

بە دەستی من بووا

بەهەشتم دەسووتاند و

ئاگری دۆزەخیشم دەکوژاندەوە.

بۆم گرنگ نییە

ژیانم درێژبێ

بەڵام دەمەوێ قووڵبێ

دەمەوێ من

بەناو رۆژەکاندا تێپەڕم

نەک رۆژەکان

بەناو مندا تێپەڕن.

•

ماوە ماوە پێویستمان بەوەیە

بە تەواوی ون بین و

کەس نەتوانێ بماندۆزێتەوە.

هەر کەس دەتوانێ

لە درەوشانەوەتدا هەڵتبژێرێ

بەڵام من لەو کاتەش هەڵتدەبژێرم

کە دادەمرکێیت

دڵنیابە ئەگەر من نووریش

لە کەسێکیترەوە ببینم

ئەوە تاریکیی تۆ هەڵدەبژێرم.

•

دڵی شکاو

حەشارگەی گەنجینەیە.

•

خەڵکانێکم بینیوە

ژیان هەرچەندی لێ سەندبن

هەر دەوڵەمەند ماون و

هەندێکیش هەرچەندیان

لە ژیان سەندبێ

هەر هەژار ماون.

•

من لاڵم و خەونێکم بینیوە

خەڵکیش هەمووی کەڕن

نە من دەتوانم

بیگێڕمەوە و

نە ئەوانیش دەتوانن

بیبیستن.

چەند کەسی تەنیا هەن و

هەست بە تەنیایی ناکەن؟

ئەی چەند کەس هەن لەناو کۆمەڵدان و

هەست بە تەنیایی دەکەن؟

تەنیایی

تەنیایی ویژدانە نەک جەستەکان.

•

کاتێ ژیان

لەگەڵ شتێک

لە تۆدا کۆمدەکاتەوە

هەزار ژیان

لە دڵمدا بە ئاگادێتەوە.

ڕۆژانێک هەبوون

لە ژیانت

پێتوابوو تێناپەڕن

ئەو ڕۆژانە غەمی گەورەت بوون

کەچی تێپەڕین و

لە یادیش چوونەوە

ئێستا دڕدۆنگ مەبە

ئێستاش تێدەپەڕێ.

•

با خەمت گەڕان بێ، نەک گەیشتن.

کاتێ گوتم: دڵم لە قوڕە

گاڵتەی پێکردم

چونکە دڵی ئەو لە ئاسنە..

بەو نزیکانە باران دەبارێ

دڵی من

گوڵدەگرێ و

دڵی ئەویش

ژەنگهەڵدێنێ.

•

ژیان بۆ ئەوانەیە

کە پارێزگارییان

لە منداڵیی خۆیان کرد و

سەریان بۆ لۆژیکی گەورەکان

کەچ نەکرد.

•

روودەدا کە من لە شوێنێ بم و

دڵیشم لە شوێنێکی دیکە.

•

ئەگەر داوات لە خوا کرد

بیرت ساغبێ و بحەسێیتەوە

ئەوە لات سەیر نەبێ

کە خەڵک جێیانهێشتی.

•

لەو کەسانە نزیکبە کە شادت دەکەن

تا هەست بکەیت هێشتا زیندوویت.

ئەگەر رێککەوتی مرۆڤێکی حەقیقیتکرد

لە دەستیمەدە

رێمەدە هەرگیز لە ئاسۆی رۆحت ئاوابێ.

•

پێیگوت:

دڵ خۆی بۆ ئەوە لار دەکاتەوە

کە لە خۆی دەچێ.

دەتوانین

بە زوهد و رۆژوو

جەستەمان پاک بکەینەوە

بەڵام تەنیا خۆشەویستیی

دڵەکان پاک دەکاتەوە.

•

بە دوای خەڵکدا مەگەڕێ

خەڵک وەک دیاریی بۆت دێن

لە ڕێگای گەڕان بە دوای خۆتدا.

لەوانە نزیک بکەوە

کە پەنجەرەیێ لە نوور

لە رۆحتدا ئاوەڵا دەکەن و

پێت دەڵێن:

تۆ دەتوانی

جیهان رووناک بکەیتەوە.

•

سەرباری هەموو شتێ شادبە

وەک ئەوەی منداڵێکی بچووک بیت.

گرنگتر لە سەفەر و شوێنی سەفەر

ئەو ویژدانەیە کە لە ناختە

گۆڕینی شوێن چ سوودێکی هەیە

کە تۆ خۆت بیت.

•

لە نێوان واقیع و خەیاڵ

سنووری هەیە

من هی ئەوێم.

•

دوو شت

مانا بە ژیانٍ دەبەخشن:

باوەڕت بە قەزیەک بێ و

کەسێکت خۆشبوێ.

•

لە مەرگ مەترسە

بەڵکو لە ژیانێکی بێژیان بترسە.

•

ئەو ژیانە قبوڵ مەکە

کە تێیدا هەست بە ژیان نەکەی.

•

ئەی موسافیر گوڵ بکڕە

لەوانەیە لە ڕێگادا

کەسێ ببینی

شایەنی بەخشینی گوڵبێ.

•

.بەبێ دەنگ

سڵاوم لێکردیت:

حاڵت چۆنە ئەی هەموو حاڵم؟

•

پێویستیت بەوە نییە

بە دوای بەختەوەرییدا بگەڕێیت

بەختەوەریی خۆی دێ

ئەگەر شوێنی نیشتەجێبوونت

لە دڵتدا بۆی ئامادەکردبێ.

تۆ هەست بە تەنیایی دەکەیت

لەبەر ئەوەنا کە کەست لەگەڵدا نییە

بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە خۆت ـ

لەگەڵ خۆتدا نیت.

•

بە خوێندنەوە فێردەبیت

بەڵام بە خۆشەویستیی تێدەگەیت.

•

دەبێ تێبگەیت کە تەمەن تەنیا ژمارەیە

تەمەن هەرگیز حەقیقەتی تۆ پێکناهێنێ

دەشێ منداڵێکی شەست ساڵان بیت و

پیرێکی بیست ساڵانیش.

•

هەر شەوێک

مانگی خۆی هەیە

هەتا ئەو شەوەی کە لە ناخیشتدایە.

•

سەرچاوەکان:

/https://xn--sgb8bg.net_

_ویکیبدیا

